چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی نوح

## (سڵاوی خوای لێبێت)

2


نووسەر : کەمال سەید

وەرگێڕانی : ئازاد عەبباس گڵێجاڵی


وێنە : حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 978-9922-626-65-9
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1328)ـی ساڵی (2018)ـی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕێنوێن**

07701932749 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# چیرۆکی حەزرەتی نوح

## (سڵاوی خوای لێبێت)

نووسەر : کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەییە عەبدوڵڵا

## نوح پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت)

ساڵی (١٩٥١)ی زایینی، تیمێکی زانستی لە سەر کێوی جودی لە زنجیرە چیاکانی ئارارات، لە سەر خاکی کوردستان چەند پارچە تەختەیەکیان دۆزییەوە کە مێژووەکەی بۆ (٢٥٠٠) ساڵ پێش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا دەگەڕێتەوە..

لە نێوان ئەو پارچە تەختانەدا پارچەیەکی تیابوو کە بە زمانێکی کۆن هەندێ شتی لەسەر نووسرابوو.. دوای دوانزە مانگی ڕەبەق لێکۆڵینەوە لەو پارچە تەختە، لیژنەی لێکۆڵینەوە چەند ئەنجامێکی سەرسوڕهێنیان ڕاگەیاند..

ئەو چارچە تەختەیە بەشێک بوو لەو کەشتییەی کە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بۆ ڕزگاربوون لە لافاوە مەزنەکە دروستی کردبوو..

هەر بەڕاست چیرۆکی ئەو لافاوە چییە و چۆنە؟..

چیرۆکی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) چییە و چۆنە؟..

لە سەردەمانی زۆر کۆن و کەونارادا هەموو خەڵک یەک ئایینیان هەبوو.. ژیانێکی سادە و خۆشیان هەبوو.. زۆربەی خەڵک بە جوتیاری و کشتوکاڵ و ڕاوکردنەوە خەریک بوون..

ساڵان و مانگان و ڕۆژگار تێدەپەڕی و خەڵکە بەهێزەکان بەربوونە گیانی خەڵکی بێدەسەڵات و لاواز و دەستیان کرد بە ستەمکاری و چەوساندنەوەی هەژاران..

هەژارەکانیش بە ژیانی کولەمەرگی و نانەزگی ڕازی بوون.. سەریان بۆ داوای ستەمکاران دانەواند..

لەو کاتانەدا بتپەرەستی و خراپەکاری زۆر بەربڵاو بوویەوە.. خەڵکی هەژار و لانەواز لە دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندەکان دەترسان.. دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندەکانیش خەریکی ستەمکاری و چەوساندەوەی هەژاران بوون، کەچی لەولایشەوە خەریکی بتپەرەستی بوون!..

لەو سەرزەوییەداکە پێی دەگوترا (بلاد الرافدین) یان (بین النهرین) کە زۆربەی خاکەکەی بەر کوردستان دەکەوێ، نوح(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا دەژیا..

لەو سەردەمەدا خەڵکی خواپەرەستییان لەبیر کردبوو.. سەریان کردبووە بتپەرەستی..

بە دەستی خۆیان لە دارو بەرد بتیان هەڵدەکۆڵی و دوایی ئەو بتانەیان دەپەرەستی..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر خەفەتی دەخوارد.. گەلەکەی دەبینی کە تێکرا هەموویان سوژدە بۆ ئەو بتانە دەبەن کە ناویان (وەد، سواع، یەغوس، یەعوق و نەسر) بوو..

## پەیامی ئاسمانی

خوای گەورە نوح(سڵاوی خوای لێبێت)ی هەڵبژارد بۆ ئەوەی بیکات بە پێغەمبەری خۆی و خەڵکی بانگ بکات بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ئایینی ڕاستەقینە و پاک و یەکتاپەرەستی و وازهێنان لە بتپەرەستی و فرە خواپەرەستی..

نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بە گەلەکەی فەرموو: ئەی گەلی من! خزمینە! من پێغەمبەر و نێردەی خوای گەورەم بۆ لای ئێوە.. خوا ئەو خوایەیە کە ئێوەی دروستکردووە و ڕزق و ڕۆزی ئێوە دەدا..

﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً * يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً﴾ نوح: ١٠-١١ واتە: داوای لێبووردن لە پەروەردگار بکەن، بێگومان ئەو زۆر لێبووردەیە.. تا بارانی بە لێزمە و خوڕەمتان بۆ بارێنێ.

خوای گەورە بارانی پڕ لە خێر و فەڕتان بۆ دەبارێنێ، ئیتر چۆن ئێوە واز لەو خوایە دێنن و دەچن بتەکان دەپەرەستن؟!..

خەڵکی سەریان سوڕمابوو.. لە ناو خۆیاندا دەیانگوت: باشە نوح(سڵاوی خوای لێبێت)ی دارتاش چۆن دەوێرێ ئاوا سووکایەتی بە بتەکان بکات؟..

پیاوە دەسەڵاتدارەکان ڕقیان لە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵگرت.. لە قسەکانی دەترسان.. ئەو بانگەوازی برایەتی و یەکسانی و دادپەروەری و ئازادی هەڵگرتبوو.. دەیگوت: نابێ بەهێزەکان ستەم لە هەژارەکان بکەن.. نابێ دەوڵەمەندەکان نەدارەکان بچەوسێننەوە.

لەبەر ئەوە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان بە هەموو جۆرێک ڕووبەڕووی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دەوەستانەوە.. جەنگیان لەگەڵدا دەکرد.. ناووناتۆرەیان بۆ هەڵدەبەست.. دەمێک دەیانگوت: نوح(سڵاوی خوای لێبێت) شێتە!.. دەمێک دەیانگوت: نوح(سڵاوی خوای لێبێت) درۆزنە!.. جاریکیش دەیانگوت: کوڕە ئەوە دارتاشێکی هەژار و بێدەسەڵاتە، ئەگەر پێغەمبەر بووایە ئێستا سەروەت و سامانێکی زۆری هەبووا!..

خەڵکە هەژار و لاوازەکان لە دەسەڵاتدارەکان دەترسان.. وایان بیر دەکردەوە کە ئەو بتانە هەر بەڕاستی خوان، دەسەڵاتیان هەیە و یارمەتی دەسەڵاتدارەکان و دەوڵەمەندەکان دەدەن!..

هەر لەبەر ئەوە ئەو هەژارانە نایاندەوێرا بڕوا بە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بکەن.. نەیاندەوێرا واز لە بت و بتپەرەستی و کۆیلایەتی بۆ دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکان بێنن!.. بۆیە زۆر جار پەنجەی خۆیان دەکرد بە کونی گوێی خۆیاندا، بۆ ئەوەی گوێیان لە قسەکانی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) نەبێ!..

## بڕواداران

ژمارەیەکی کەم لە هەژارەکان بڕوایان بە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) کرد و هاتنە ڕیزی بڕوادارانەوە.. بە دزییەوە دەهاتنە ماڵی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و گوێیان لە پەیامەکانی خوای گەورە دەگرت.. گوێیان لە ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دەگرت.. بەو گوێگرتنە دڵیان پڕ دەبوو لە باوەڕ و ورەیان تەواو بەرز دەبوویەوە..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بە نهێنی و ئاشکرا بانگەوازی خۆی دەکرد.. بە شەو و ڕۆژ ڕانەدەوەستا.. بەڵام سودێکی ئەوتۆی نەبوو..

ڕۆژێک بێبڕواکان هاتن بۆ لای حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و پێیان گوت: تۆ دەتەوێ ئێمە بڕوا بە تۆ بکەین و شوێنت بکەوین، کەچی هەندێ پیاوی هەژار و لات و لوت نەبێ کەس شوێنت نەکەوتووە!؟..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئەوانە برای ئێمەن.. خەڵکی هەموو یەکسانن و کەس لە کەس زیاتر نییە!..

بێباوەڕەکان وتیان: درۆ دەکەیت!.. تۆش خۆت دارتاشێکی هەژاریت!..

بەڵام حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) نائومێد نەبوو.. لە هەوڵدان نەوەستا.. بەردەوام بوو لەسەر بانگەواز.. نۆسەدوپەنجا ساڵ بانگەوازی کرد.. تەمەنی بەسەرچوو.. پیر بوو.. بەڵام وەکو کێو خۆڕاگر و بەهێز بوو.. بەرامبەر هەموو کافر و بێباوەڕە دەسەڵاتدارەکان دەوەستایەوە.

## نەفرەت

ڕۆژێک پیاوێکی زۆر پیر کە بە یارمەتی گۆچان ڕێی دەکرد، لەگەڵ کوڕەزایەکی خۆیدا هات بۆ لای حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت).. پیاوە پیرەکە بە کوڕەزاکەی خۆی وت: کوڕم! سەیری ئەم پیاوە بکە، بیناسەوە، ئەوە شێتە، هەرگیز بڕوای پێ نەکەیت!.. ئەگەر گەورە بوویت و پەرەستشی (وەد، سواع، یەغوس، یەعوق و نەسر)ت کرد، وریابە ئەم پیاوە شێتە فریوت نەدات و پەشیمانت نەکاتەوە!..

منداڵەکە گۆچانەکەی لە باپیری وەرگرت و گرتییە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت)..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد، بەڵام خۆڕاگربوو.. زۆربەی هەرە زۆری خەڵک بڕوایان پێ نەدەکرد.. تەنانەت ژنەکەی خۆی بڕوای پێ نەدەکرد، ئەویش وەک خەڵکی تر بێباوەڕ بوو..

ڕۆژێک فریشتەیەک لە ئاسمانەوە هات بۆ لای حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و پێی وت: تەواو جگە لەوانە نەبێ کە بڕوایان هێناوە، ئیتر هیچ کەسێکی تر بڕوات پێ ناکات و نایەتە ڕیزی بڕوادارانەوە!.. نەفرەتی خوای گەورە بێباوەڕانی گرتووەتەوە.

ئا لەو کاتەدا حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و فەرمووی: ﴿وَ قالَ نُوحٌ رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكافِرِينَ دَيّاراً * إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبادَكَ وَ لا يَلِدُوا إلاّ فاجِراً كَفّاراً﴾ نوح: ٢٦–٢٧ واتە: پەروەردگارا هیچ کەسێك لە بێبڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵە و تۆویان ببڕە...

چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان
لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی
تۆیە گومڕای دەکەن و هەر
منداڵێکیشیان لێ ببێ، تاوانبار و
سپڵە دەبێ.

## گەمییەی ڕزگاری

خوای گەورە سروشی بۆ حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) نارد بۆ ئەوەی کەشتییەکی گەورە دروست بکات.. حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) لە دەرەوەی شار شوێنێکی تەختایی هەڵبژارد بۆ ئەوەی کەشتییەکەی تێدا دروست بکات..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دارتاشێکی زۆر ژیر و لێزان بوو.. دەبوو بڕێکی زۆر دار و تەختە کۆ بکاتەوە.. ئەوانەی بڕوایان بە حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) هێنابوو، هەموویان هاتن بۆ یارمەتیدانی..

هەموویان پێکەوە داریان کۆ دەکردەوە.. تەختەی جۆراوجۆریان دەتاشی و ئامادەیان دەکرد..

دروستکردنی گەمییە و کەشتی ئاسان نەبوو.. چونکە زۆر گەورە بوو.. گەمییەکە سێ نهۆم بوو.. درێژیەکەی نزیکەی سەد مەتر و پانتاییەکەی نزیکەی حەفتا مەتر و بەرزییەکەیشی نزیکەی بیست و پێنج مەتر بوو..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و هاوڕێ بڕوادارەکانی بە گرنگییەکی زۆرەوە خەریکی دروستکردنی کەشتییەکە بوون..

بەڵام بێباوەڕان گاڵتەیان پێدەکردن و بە دەم حیلکانەوە دەیانگوت: کوڕە تەماشای ئەو شێتانە بکەن، ئا لەم سارا چۆڵ و وشکەدا خەریکی دروستکردنی کەشتین!..

پیاویکی بێباوەڕ وتی: نوح(سڵاوی خوای لێبێت) خەرەفاوە و عەقڵ و ئاوەزی لە دەست داوە و نازانێ چی دەڵێت و چی دەکات!..

یەکێکی تر وتی: نوح(سڵاوی خوای لێبێت)! ئەوە خەریکی چیت؟.. کوا دەریا؟ کوا ئاو تا تۆ کەشتییەکەتی تێدا بەکار بهێنیت؟!..

یەکێکی تر بە تەنزەوە دەیگوت: کوڕە چاڕۆکەت لەبیر نەچێ، دەریا ڕەشەبا و شەپۆلی زۆر و بەهێزە!..

پێغەمبەر نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دەیفەرموو: ڕۆژێک دێ ئێمە گاڵتە بە ئێوە بکەین!..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و بڕواداران لە دروستکردنی گەمییەکە بوونەوە.. گەمییە ئامادەیە.. باوەڕداران دەهاتن بۆ سەیرکردنی.. چاوەڕێ بوون بەم زووانە خوای گەورە لە دەست ستەم و ستەمکاران ڕزگاریان بکات..

لەولاشەوە گاڵتە و سووکایەتی بێباوەڕان لە زیادبووندا بوو.. دەسەڵاتداران سزاکانیان لەسەر بڕواداره لاوازەکان زیاتر دەکرد..

ڕۆژێک ژنێک دەستی کچە بچکۆلانەکەی خۆی گرت و هاتە خزمەت حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و وتی: کەی ڕزگارمان دەبێ؟.. کەی خوای گەورە لە دەست ئەم ستەمکارانە ڕزگارمان دەکات؟..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) نەیدەزانی چ ڕۆژێکە، بۆیە پێی گوت: تەنیا خوا خۆی دەزانێ!..

ئا لەو کاتەدا فریشتەیەک هاتە سەر زەوی بۆ لای حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و پێی وت: هەرکاتێ تەنووری ماڵی ئەم ژنە پڕبوو لە ئاو، ئەوە ئیتر باران و تۆفان دەست پێدەکات و سەرەتای ڕزگاربوونی ئێوە و شکستی ستەمکارانە!..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بە ژنەکەی ڕاگەیاند و فەرمووی: خوای گەورە نیشانەیەکی بۆ دیاری کردووین، هەرکاتێ تەنوورەکەی ماڵی ئێوە پڕبوو لە ئاو، ئەوە ئیتر سەرەتای ڕزگاربوونی باوەڕداران و شکست و لەناوچوونی ستەمکارانە!..

ئەم هەواڵە لە ناو بڕواداراندا بڵاو بوویەوە..

ڕۆژێک هەورێکی ڕەش بەری بە ئاسمان گرت.. حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) چاوەڕێی فەرمانی خوای گەورە بوو.. کچە بچووکەکە بە ڕاکردن هاتە خزمەت حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و پێی وت: تەنوورەکەمان پڕ بووە لە ئاو!..

خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەجێهێنا.. هەندێک لە بڕواداران لە خۆشیدا دەگریان.. ئاسمان پڕ بوو لە هەوری ڕەش.. ئەو ڕۆژە وەک شەو تاریک داهات..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بانگی بڕوادارانی کرد و فەرمووی: یەڵڵا با هەموومان پێکەوە بچینە نێو گەمییەکە..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمانی پێکردن کە لە هەر ئاژەڵێک نێر و مێیەک بخەنە نهۆمی خوارەوەی گەمییەکە.. بەڵام شوێنی باڵندەکان لە نهۆمی سەرەوە بوو.. بڕوادارانیش لە نهۆمی ناوەڕاست..

هەور دەستیکرد بە گرمە گرم.. چەخماخەی دەدا و دەتگوت شوڵی ئاگرە!.. باران بە خوڕ دەباری.. بڕواداران سواری گەمییەکە بوون.. منداڵەکانی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) جگە لە یەک کوڕی نەبێ بە ناوی (کەنعان) هەموویان بڕوادار بوون، باوەڕیان بە باوکیان هێنابوو.. هەموویان سواری گەمییەکە بوون، بەڵام ژنەکەی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) و ئەو کوڕەی کە بڕوای نەهێنابوو سواری گەمییەکە نەبوون..

با زۆر بە توندی دەیگیڤاند.. ئاو لە هەموو بەرزایی و نزمایی و کەژ و کۆ و گرد و یاڵێک هەڵدەقوڵی.. بێباوەڕەکان لە ترسی لافاو و خنکان و مردن، هەموویان بەرەو بەرزاییەکان هەڵاتن..

## گەمییەی ڕزگاری

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) چاوەڕێ بوو کەنعانی کوڕی بگەڕێتەوە، چونکە وایدەزانی بڕوادارە.. لە دوورەوە چاوی بە کەنعانی کوڕی کەوت، بەرەو بەرزاییەکان هەڵدێ.. حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بانگی کەنعانی کرد و فەرمووی: ﴿یا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنا وَ لاتَكُنْ مَعَ الْكافِرينَ﴾ هود: ٤٢ واتە: کوڕی خۆم! لەگەڵ ئێمەدا سوارببە و لەگەڵ خوانەناسان مەبە!..

کەنعان هاواری کرد و وتی: ﴿سَآوي إِلى جَبَل يَعْصِمُني مِنَ الْماءِ﴾ هود: ٤٣ واتە: من پەنا بە چیایەک دەبەم لە ئاو دەمپارێزێ..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) دیسان بانگی کرد و فەرمووی: ﴿لا عاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ﴾ هود: ٤٣ واتە: ئەمڕۆ هیچ شتێک لە فەرمانی خوا ناتپارێزێ.

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) ویستی جارێکی تر بانگی کوڕەکەی بکاتەوە، بەڵام شەپۆلێکی بەهێز لێیدا و بردی و دووری خستەوە، ﴿وَ حالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكانَ مِنَ الْمُغْرَقينَ﴾ هود: ٤٣ واتە: شەپۆل کەوتە نێوانیان و خرایە ڕیزی خنکاوان.

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) تەماشایەکی ئاسمانی کرد و وتی: ﴿رَبِّ إِنَّ ابْني مِنْ أَهْلي وَ إِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ﴾ هود: ٤٥ واتە: ئەی پەروەرێنی من! کوڕەکەم کەسوکاری منە، بەڵێنی تۆش هەردێتەجێ.

خوای گەورە سرووشی بۆ حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) نارد و فەرمووی: ﴿قالَ يا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صالِحٍ﴾ هود: ٤٦ واتە: ئەی نوح (سڵاوی خوای لێبێت)! ئەم کوڕەت کەسوکاری تۆ نییە، ئەو ئاکاری ناپەسەندی هەیە.

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) داوای لێبووردنی لە خوای گەورە کرد و فەرمووی: ﴿رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْئَلَكَ ما لَيْسَ لي بِهِ عِلْمٌ وَ اِنْ لا تَغْفِرْ لي وَ تَرْحَمْني أَكُنْ مِنَ الْخاسِرينَ﴾ هود: ٤٧ واتە: ئەی پەروەرێنم! هەر خۆم بە تۆ دەپارێزم داوای شتێکت لی بکەم کە نایزانم؛ ئەگەر بەزەییت پێمدا نەیە و لێم نەبووری یەکێکم لە زیانباران.

دواتر حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) بانگی کرد و فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللّهِ مَجْراها وَ مُرْساها﴾ هود: ٤١ واتە: ڕۆیشتن و لەنگەر گرتنی بە ناو خوایە.

## وشە پیرۆزەکان

گەمییەی ڕزگاری دەریای دەبڕی و بە ناوەڕاستی شەپۆلە مەزنەکاندا دەڕۆیشت.. سەرزەوی ببوو بە دەریایەکی زۆر زۆر مەزن.. ئاو هەموو چیاکانی داپۆشی.. چل ڕۆژ و شەو ئاسمان بە خوور بارانی دەباراند..

بڕواداران لە ناو گەمییەکەدا لە نزیک تەتەڵەیەکی بچووکی پێشەوەی گەمییەکە کۆ بوونەوە..

ئەو تەتەڵەیە نوشتەیەکی بچووکی لەسەر نوسرابوو.. نوشتەی پیرۆز.. وشە پیرۆزەکان..

(ئەی خودای من!.. پەروەرێنم!.. فریادڕەسم!. بە بەزەیی خۆت فریام بکەوە..

لەبەر ئەم گیانە پیرۆزانە..

موحەممەد، ئیلیا، شەبر، شەبیر و فاتمە..

ئەوانە هەموویان گەورە و بەڕێزن..

دونیات لەبەر ئەوانە ڕاگرتووە..

لەبەر ئەوانە یارمەتیم بدە..

تەنیا تۆ دەتوانی بمخەیتە سەر ڕێگای ڕاست).

## چڵە زەیتوون

دوای چل شەو و ڕۆژ باران بارین، باران وەستایەوە.. کەمە کەمە هەورەکان ڕەوینەوە..

خۆر دەرکەوتەوە.. ڕەنگە جوانەکانی پەلکەزێڕینە لە ئاسۆوە دەرکەوتن.. هەموو شتێک دیمەنی ژیانەوەی لێ دەردەکەوت..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) قەلەڕەشێکی هەڵفڕاند ـ بۆ ئەوەی هەواڵێکیان بۆ بێنێتەوە ـ قەلەڕەش زۆر دوورکەوتەوە و دوای ماوەیەک هاتەوە.. هیچ وشکایی دەست نەکەوتبوو.. تەنانەت لوتکەی کێوەکانیش لە ناو ئاوا نقوم ببوون..

بۆ جاری دووەم حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) کۆترێکی سپی هەڵفڕاند.. کۆترەکە ڕۆیشت.. هەتا چاو بڕی دەکرد ڕۆیشت.. دوای ماوەیەک هاتەوە و بە دەنووکە پەمەییەکەی چڵێکی بچووک زەیتوونی هەڵگرتبوو..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر خۆشحاڵ بوو.. باوەڕدارانیش هەمووان خۆشحاڵ بوون.. لافاو کۆتایی هات.. خوای گەورە نەتەوەی مرۆڤی لە خنکان و تیاچوون پاراست.. سەرزەوی پاک بوویەوە و مرۆڤی بێباوەڕ و ستەمکاری تێدا نەما..

بۆ جاری سێیەم حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) باڵندەیەکی هەڵفڕاند.. هەمان ئەو کۆترەی هەڵفڕاند کە بە دەنووک چڵێ زەیتوونی هێنابوویەوە.. بەڵام ئەمجارە نەگەڕایەوە.. خەریکی دروستکردنی هێلانەیەک بوو بۆ خۆی، بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ دەست پێ بکاتەوە!..

گەمییەکە بەرەو لای باکوور دەڕۆیشت.. تا گەیشتە دوورگەیەکی زۆر بچووک.. ئەو دوورگە بچووکە لوتکەی کێوی جودی بوو لە کوردستان..

خوای گەورە فەرمانی بە سەر زەوی و ئاسماندا کرد و فەرمووی: ﴿وَ قيلَ يا أَرْضُ ابْلَعي مائَكِ وَ يا سَماءُ أَقْلِعي وَ غيضَ الْماءُ وَ قُضِيَ الأَمْرُ وَ اسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَ قيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظّالِمينَ﴾ هود: ٤٤ واتە: ئەوجا گوترا: زەوی ئاوت هەڵقوڕێنە! بەرزایی بەس ببارێنە! ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا، کار سەری گرت، لەسەر جودی لەنگەری گرت، وترا: تارن، ئەوانەی ناهەقیکارن!.

کێوەکان دەرکەوتن.. تەنانەت گرد و یاڵ و تەپۆڵکەکانیش دەرکەوتنەوە.. شیو و دۆڵەکان پڕبوون لە ئاو..

خوای گەورە سروشی بۆ حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) هەنارد و فەرمووی: ﴿اهْبِطْ بِسَلامٍ مِنّا وَ بَرَكاتٍ عَلَيْكَ وَ عَلى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ﴾ هود: ٤٨ ئەی نوح وەرە خوارەوە و دابەزە لە کەشتییەکە و لە چیای جودی بۆ دەشتایی بەبێوەیی و سەلامەتی لەلایەن ئێمەوە، بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆ و ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان.

سەرزەوی پاک و خاوین بوویەوە.. باوەڕداران دەستیان کردەوە بە ژیانی ئاسایی خۆیان.. کۆمەڵگایەکی زۆر بچووک بوون.. بەڵام پاک و خاوێن، بڕوادار، هیچ کەسێکیان تێدا نەبوو کە ستەمکار بێ، دز و جەردەیان تێدا نەبوو.. خوانەناسیان تێدا نەبوو.. هیچ کەسێک ستەمی لە هیچ کەسێک نەدەکرد..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) تەمەنێکی زۆری بەسەر برد.. چەندین سەدە ژیا.. پێش هاتنی لافاو، بۆ ماوەی نۆسەدوپەنجا ساڵ لە ناو گەل و هۆزەکەی پێغەمبەر بوو.. ئیتر هەر خوا خۆی دەزانێ لە تەمەنی چەند ساڵی، بوو بە پێغەمبەر.. ماوەی چەند ساڵ دوای لافاو ژیا؟!..

هیچ کەس نازانێ تەمەنی حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) چەند بووە.. بەڵام بێگومان تەمەنێکی زۆر زۆری بەسەر برد.. دوای ئەو تەمەنە دوور و درێژە کاتێ فریشتەی گیانکێشان هات بۆ ئەوەی گیانی بکێشێ، لێی پرسی: ژیانت چۆن هاتە بەرچاو؟..

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) لەو کاتەدا لەبەر هەتاو دانیشتبوو، هەستا چوویە بەر سێبەرێک.. فەرمووی: ئەوەندە!...- واتە: وەک ئەوەی لەبەر هەتاو، بێیتە بەر سێبەر- بۆیە حاجی قادری کۆیی دەفەرمووێ:

مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە

حەزرەتی نوح(سڵاوی خوای لێبێت) چاوەکانی نوقاند وماڵئاوایی لە ژیان کرد.. ئەو ژیانی مرۆڤی لە تیاچوون پاراست.. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿سَلامٌ عَلى نُوحٍ فِي الْعالَمِينَ﴾ الصافات: ٧٩ واتە: سڵاو لە نوح، لە سەرانسەری دونیادا.

# چیرۆکی پێغەمبەران

2

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پرشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات..

بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەنێوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..

ناوەندی ڕێنوێن
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

9 789922 626659